- **ناوی کتێب:** فەرهەنگی پزیشکی دەوەن (ئیگلیزی ـ عەرەبی ـ کوردی)
- **دانانی:** دکتۆر جەمال ڕەشید
- **تیپچنین:** بەدرخان بەکر
- **دەرهێنانی هونەری:** ناسر منبەری ـ حسێن سەنعان مەتیخان
- **بەرگ:** عۆسمان پیر داود
- **چاپی یەکەم**
- **تیراژ:** (٧٥٠) دانە
- **ژمارەی سپاردن لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان لە هەولێر (٢٣٧٧) لە ساڵی ٢٠١٠**
- **چاپخانەی:** حاجی هاشم/ هەولێر

# فەرهەنگی پزیشکی دەوەن

## ئینگلیزی - عەرەبی - کوردی

**( نزیکەی شەست و پێنج هەزار زاراوەی پزیشکی گرتۆتە خۆ )**

**( بەشی یەکەم )**

پێداچوونەوە و ساغکردنەوە و بژار و
هەڵەچنیی چاپ و تەواوکاری:
جەمال عەبدول

دانانی:
دکتۆر جەمال ڕەشید

# پێشەکی

ساڵی ١٩٩٥، لە هەولێر، (ڕێکەوت) فەرهەنگێکی پەزیشکیی دەستنووسی دەهەزار زاراوەیی (ئینگلیزی – عەرەبی – کوردی)ی دکتۆر عەبدورڕەحمان عەبدوڵڵای خستە بەر دەستم، کە بە کوردییەکی ڕەوان و خۆماڵی و خەتێکی واجوان نووسیبووی، چاو و دڵی ڕۆشن و فێنك دەکردەوە، بە پەرۆشەوە دەستم کرد بە خوێندنەوە و بە وردی پێداچوونەوەی و دام نەنا تا تەواوم کرد و، بیروڕای خۆم وەك پەراوێز لەسەر هەندێکیان نووسی و بە بۆچوونی خۆم وشەی گونجاوترم بۆ دانان و لەدڵی خۆمدا، بڕیارم دا پێشەکییەکی بۆ بنووسم و لەو ئاخۆران و بخۆرانە و باردودۆخە لە هەموو ڕوویەکەوە نالە بار و کەمدەرامەتییەی حکومەتی هەرێم و زەبوونی و گەمارۆ و هاوکاری نەکردنی تایبەتی وەزارەتی ڕۆشنبیرییەوە، هەرواماوەیەوە و نەمتوانی چاپی بکەم، دواتریش بەداخەوە لە ڕووداوە پڕ ناسۆرەکانی ئەو دەمانەی کوردستاندا لەناوچوو..!!

دوای چەند ساڵێك، لەسلێمانی بە دیداری دکتۆر ئەورەحمان شادبووم و باسی داخ و پەژارەی بە سەرهاتی لە ناوچوونی فەرهەنگەکەییم بۆ کرد، ئەویش باسی دەستنووسی ئامادەی ئینسایکلۆپێدیایەکی پەزیشکیی خۆی بۆ کردم و داوای بۆ چاپکردنی لێ کردم، منیش بە ڕەزامەندیی خۆی، پێیداچوومەوە و ئەوەندەی پێویست بکات سووکە دەستکارییەکی ڕێنووس و گۆڕینی گەلێك زاراوەم کرد و دواتریش چەند جارێك پێداچوونەوە و هەڵەچنیی کۆمپیوتەر کراوەکەی و، ئەوەبوو بە کۆمەکی دڵسۆزانەی ناوەندی چاپەمەنی و ڕاگەیاندنی خاك، چاپ کراو پێش کۆچی دوایی بە

چەند ڕۆژێك دانەیەك و نامەیەکی خۆمم گەیاندە دەستی و ئەو ئاواتەی ئەویش و منیش هاتەدی..!

پاش ماوەیەك بیستم کە دکتۆر (جەمال ڕەشید)یش دەستنووسی فەرهەنگێکی فراوانی پەزیشکی وای هەیە، ئیتر پەرۆشی لە دەستنەچوونی ئەویش خستمییە پەیجوورِ و هەوڵی دەستکەوتنی ئەو فەرهەنگە و لە خانەوادە بەڕێزەکەیم ڕاسپارد کە بۆ ئەوەی ئەو گەوهەرە لە کیس کتێبخانەی لەو بوارەدا هەژارەی کوردی نەچێت، مـن ئامادەم پێیدابچمەوە و ئامادەی بکەم بۆ چاپ و هەوڵی چاپکردنیشی بۆ بدەم، ئەوە بوو ڕۆژێك برای خۆشەویستم کاك دکتۆر کاوس عەزیزی ئامۆزای، بە تەلەفۆن مژدەی لە بەغا هێنانەوەی فەرهەنگەکەی دامێ و لە کارتۆنێکی گەورەدا هەموو دەستنووسە پەیوەندیدارەکانی بۆ هێنام، پاش چاوپیاخشاندنی، مەزنیی کارەکەی و ڕەنج و ماندبوونی زۆری لە ئامادەکردنی ئەو شاکارەدا، کە بەڵگەی خەمخۆری و دڵسۆزی و نەتەوە و نیشتمانپەروەریی ئەو جوامێر و پیاو چاکە بوو بۆ زمان و وشەی شیرینی کوردی و بەکارهێنانێکی ورد و ئاگادار و شارەزایانەی زانستە زاراوەی نوێباوی کوردی بوو لە نووسینی بەرهەمێکی بێ وێنەی وادا.

ئەوەی ڕاستی بێ، گەورەیی فەرهەنگەکە و خەم و پەرۆشیم بۆ خزمەتی بێ منەتی وشەی کوردی و لەدەست نەچوونی ئەو شاکارە و بە فیڕۆ نەچوونی ئەو ڕەنجە پیرۆزە، وای لێ کردم کە بیر لە هیچ شتێك و کەمیی کات و زۆری و سەختی و فرە لایەنیی و پێویستیی تەواو و فریاخستنی ئەرك و کارەکانی خۆم و شەکەتی و بەرەو کەنەفتی چوونم و زۆر شتی تریش نەکەمەوە و دەستم کرد بە پێداچوونەوەیەکی ورد و دەستکاریی ڕێنووس، و ئەوەندەی پێویست بکات و چێژ و بەرامەی خۆشی شێوازی نووسینە سادە و خۆڕسکەکەی نەشێوێت و، تەواو کردنی هەموو ئەو لاپەڕە و وشە و زاراوانەی کە بە سپێتی هێشتبوونیەوە و نوێسازی و دەستکاریی ناوی ئەو دەرمان و زاراوە کیمیایی و فیزیایی و زیندەوەر زانییانەی لەسەرچاوە و فەرهەنگ و کتێبەکانی ئەو سەردەمانەدا بەکارهێنراون کە ئەم سوودی لێ وەرگرتوون، هەر بەو پێیەیش ساغکردنەوە و دەستکاریی سەدان و بگرە هەزاران زاراوە و پڕکردنەوە و تەواوکاریی کەلێن و ناتەواوییەکانی، لەماوەی نزیکەی ساڵێکدا...!

به باوەڕی من، ئەم فەرهەنگە بە نرخەی خوالێخۆشبوو، شاکارێکی تا ئێستا لەو بوارەدا بێ وێنەیە لە کتێبخانەی کوردیدا و بە کوردییەکی پاراو و سادە و ڕەوانی هەموو کەس لێ تێگەییو و سەلیقە و شارەزاییەکی پەنجا ساڵەی پەزیشکێکی هەتەر و کارامە نووسراوە و سوودی لەگەڵێك سەرچاوە و فەرهەنگ و کتێبی پەزیشکی و زمانەوانیی کۆن و نوێ وەرگرتووە و سەرەتایەکی دڵخۆشکەریشە بۆ زانستاندنی زمانی شیرین و بێنازی کوردی و، بە کوردی نووسینەوەی بەشێکی قورسی زانستێکی وا گرنگ، کە تا ئێستا کەس نەی وێراوە (بەو وردی و تایبەتمەندی و فراوانییە) خۆی لەو بوارە بدات، هیوادارم توانیبێتم بەشدارییەکی هەژارانەم کردبێت لە هێنانە بەرهەم و نەفەوتانی ئەم شاکارەدا و نەمری و سەربەرزی بۆ ئەو کەڵە پیاو و پێشمەرگە خۆنەویست و لەو بوارەدا تا ئێستا نەناسراوەی کورد..

جەمال عەبدول

١٢ / ١٢ / ٢٠٠٦

سلێمانی

# A

| | | |
|---|---|---|
| A. for anode | رمز مختصر لـ آنـود (القطب الأيجابي، لأركون) | نیـشانەی ئـانۆد، ئـارگۆن، بەر، پێش |
| A-. | بادئة بمعنى لا، بلا، من غير | پێـــشگر(پـــێش بەنـــد) بەمانای نەبوون، بێ، نە |
| aa. | بمعنى من كـل مـن، اختـصاراً لـ Ana | کورتەی (Ana)یە بەمانای لە هەریەکەیان |
| Ab-. | بادئة بمعنى: من، بعيداً عن | پێـــشگر (پـــێش بەســـت) بەمانای: لە، دوور لە.. |
| Abacterial | لا جرثومي | بێ میکرۆب، نەمیکرۆبی |
| Abactus venter | إجهاض مفتعل | لـــەباربردن، منـــداڵ پـــێ فرێدان |
| Abaissement | خفض، سقوط | نـــەوین، کـــەوتن، هێنانـــە خوار |
| Abalienation | انحطاط، تـدهور (سـواء اكـان عقلياً او بدنياً) | تێکـچوون، ئـەقڵ سـووکی، شـــێتی (هۆشـــی بـــێ یـــان جەستەیی) |

| | | |
|---|---|---|
| Abarticulation, Diarthrosis | خلع، مفصل سائب | لەجێچوون، جومگەی شل |
| Abasia, Abatement | خمود(تناقص الألم او تخفيف من شدة المرض) | سووك بوون (کەمبوونەوەی ئازار، یان سووکبوونی ناساغی) |
| Abattoir | مجزرة، مسلخ | قەسابخانە، شوێنی سەربڕینی ئاژەڵ، کوشتارگە |
| Abaxial | بعيد عن المحور | دوورە تەوەرە، لە تەوەرە بەدەر(لەسەر تەوەرەی لەش نەبوون) |
| Abbeos Illuminator or Condensor | مكثف الضوء لأبي: جهاز يستعمل لتكثيف الضوء وجمعه على الاجسام الدقيقة تسهل فحصها بالمجهر | ڕووناکی چڕکەرە، ڕووناک کەرەوەی (ئابێ)، ئامرازێکە بۆ کۆکردنەوەی ڕووناکی، لەسەر میکرۆسکۆپ چەسپ دەکرێت و بریتییە لە چەند زەڕەبینێك (هاوێنەیەك) |
| Abderhalden's Tests for: 1- pregnancy 2- cancer 3- dementia praecox | اختبار (أبدرهالدن): ١ـ تشخيص وجود الحمل ٢ـ السرطان ٣ـ العته المبكر | تاقیکردنەوەی (ئەبدرهالدن) بۆ دیاریکردنی ١ـ زگپڕی، ئاوسی ٢ـ (سەرەتان)، قرژاڵە، تیراوێ ٣ـ هەرزەشێتی، شێتی هەرزەکاری (شیزۆفرینیا) |
| Abdomen | البطن، التجويف البطني | سك، زگ، بۆشایی زگ |

| | | |
|---|---|---|
| A,. Pendulous | البطن المتهدل | ورگنی، سکی شۆڕ، ورگی زل، ورگن |
| Abdominal | بطني | زگی، سکی، پەیوەند بە سکەوە |
| A. Aneurysm | (انورسما) أم الدم الأبهر البطني | ئەنیوریزمی، ئەینوریزمی ئاوەرتای زگ، کشانی شاخوێنبەری سك |
| A. Aorta | الأبهر البطني | ئاوەرتای زگ، شاخوێنبەری ناو سك |
| A. Cavity | التجويف البطني، جوف البطن | بۆشایی ناو سك، بۆشایی زگ |
| A. Pregnancy | الحمل البطني (خارج الرحم) | هەناوە ئاوسی (ئاووسیی ناو سك) (لە دەرەوەی منداڵدان بەلاَم لەناو سکدا) |
| A. Respirations | تنفس بطني (بواسطة الحجاب الحاجز والعضلات البطني) | زگە هەناسە، هەناسە بەهۆی زگ و ناو پەنچکەوە |
| A. Surgery | جراحة البطن، جراحة الأعضاء البطنية | برینکاری سك، برینسازی ئەندامەکانی ناو زگ |
| A. Typhus | الحمى التيفوسية | گرانە تێ، تیفۆس، کەوتوویی |
| A. Viscera | الأحشاء | هەناو، ئەندامەکانی ناو سك |
| Abdominoanterior | البطن للأمام (وضعية الجنين داخل الرحم) | سك لە بەرەوە، زگ لەپێش(ەوە) |
| Abdominohystere- | استئصال الرحم بشق البطن | منداڵدان بڕین، بە |

| | | |
|---|---|---|
| ctomy | | هەڵــــــــــــدرینی زگ، ئەبدۆمینۆهیستەرەکتۆمی |
| Abdominothorasic | بطني صدري | سکسنگی، پەیوەندی سنگ و زگ |
| Abducens | عـصب الجـن المبعـد، العـصب القحفـي الـسادس، عــضلة مبعدة | دوورخـــەرە، شەشـــەمین ڕەگـــی کاپۆڵـــەری، ماسولکەی دوورخەرەوە |
| Abducent | مبعَد | دوورخەرە (بەڕاکێشان لە ناوەوە بەرەو دەرەوە) |
| Abduction | تبعيد | دوورخـستنەوە، ڕاکێـشان دوور لە تەوەرەی لەش) |
| Aberrant | زائغ، ضال | ئـاوارە، گوومبـوو، ونبـوو، ون |
| Aberrant Artery | الشريان الزائغ | ســوورە دەمــاری ئــاوارە، ئـــاوارە ســـوورە دەمـــار (خوێنبەر) |
| Aberration | زيغ، انحراف | ئـــاوارەیی، گـــومی، ونـــی، لادان |
| A. Mental | انحـراف عقلـي (قـد او قـد لايبلغ درجة العته) | هــۆش تێکــچوون، ئــەقڵ تێکچوون (ڕەنگە بگات یان نەگاتە ڕادەی شێتی) |
| Abeyance | تعطيل، تعليق | پەکخستن، ڕاگرتن |
| Abiogenesis, Spontaneous geuerahon | تولد ذاتي، تولد تلقائي | لەخۆوە بـوون، (زینـدەوەر لە بێ گیان پەیدابوون) |
| Abiosis | الموت، الوفاة | مردن، گیان دەرچوون |

| | | |
|---|---|---|
| Abiotrophy | قصور التغدية | کەمخۆراکی |
| Abirritant | مخفف التخريش، ملطف، مسكن | دامرکێن، دامرکێنەر، خۆشکەرەوە |
| Ablactation | فطم، فطام | له شیر برینەوە، له مەمك کردنەوە |
| Ablate | يجث، يقطع، يجز | کرتاندن، قرتاندن، برینەوە، پەڕاندن |
| Ablatio retinae | انفصال الشبكية | جیابوونەوەی تۆڕ، هەڵکەندڕانی تۆڕ (رەتینا) چاو |
| Ablepharia | مرط، عدم وجود الأجفان الخلقي | بێ پێڵوویی (بە زگماکی) |
| Ablepsia, Ablepsy | عمى، ضعف البصر | کوێری، چاوکزی، نابینایی |
| Ablution | وضوء، غسل | دەسنوێژ شتن، بە شوشتن خاوێن کردنەوەی لەش |
| Abnormal | شاذ، غير اعتيادي | بیژۆك، تەریك، نائاسایی |
| Abnormality, Abnormity | شذوذ | نائاساییێتی، نارێکی، ناتەواوی، بیژۆکی |
| Aboiment | عواء | وەڕین، وەڕە |
| Abolition | الغاء، ابطال، محو | هەڵوەشاندنەوە، لەناوبردن |
| Abomasum | المنفخة، المعدة الحقيقية للمجترات | شیلاووگ، گەدەی ڕاستەقینەی کاوێژکەران |

| | | |
|---|---|---|
| Aboral | بعيد عن الفم، مقابل الفم | دوور لـــــه دەمـــــەوە، بەرانبەری دەم |
| Aboriginal | أرمي، بدائي، متعلق بالسكان الأصليين | بنـــەڕەتی، ســـەرەتایی، پەیوەنـــدی بـــە دانیـــشتوە بنچینەییەکان |
| Abort | يجهض، يـضع حـداً لـه قبـل الأوان | لەباردەچێت، لەباردەبات |
| Aborticide | إجهاض، قتل الجنين (داخل الرحم) | لەباربـــەر، لـــەناو ســـکدا کۆرپە کوژ |
| Abortifacient | مجهض، وسيلة اجهاض | لەباربەر، هۆی لە باربردن |
| Abortion | اجهاض، اسقاط | لەبارچـوون، پـێش وەخـت فرێدان |
| A. Artificial | اجهاض مصطنع | لەباربردن، زك پێ فرێدان |
| A. Accidental | إجهـــاض طـــارىء (بـــسبب حادثة) | لەبارچوونی ڕێکەوت |
| A. Embryonic | أجهاض جنـيني (لحد الـشهر الرابع) | ئاوڵەمــە لەبارچــوون (تــا مانگی چوارەم) |
| A. Fetal | أجهــاض حميلـي (لـما بعـد الشهر الرابع) | لەبارچـوون (لـە چـوارەم مانگەوە بە دواوە) |
| A. Habitual | أجهاض معتاد | لەبارچوونی پیشەیی |
| A. Imminent | أجهاض منذر | لەبارچوونی ناکاو |
| A. Induced | أجهاض محدث | لەباربردن (پێ فرێدان) |
| A. Inevitable | أجهاض حتمي | لەبارچوونی ناچاری |
| A. Missed | أجهاض مستكن | لە سکدا مردن |
| A. Spontaneous | أجهاض ذاتي أو تلقائي | لەخۆوە لەبارچوون |

| | | |
|---|---|---|
| A. Therpeutic | أجهاض علاجي ـ طبي | لەباربردنی پزیشکی (بە دەرمان) |
| Abortionist | متعاطي الأجهاض، من يمتهن الأجهاض الجنائي | کەسێك لەباربردنی کردبێتە پیشەی خۆی |
| Abortive | مجهض، خريج | لەباربەر، پێش وەخت بوون |
| Abortus | جهيض، طرح | لەبارچوو |
| Aboulia, Abulia | نقص الأدارة أو فقدانها | بێ دەسەڵاتی، کەم دەسەڵاتی |
| Abrachia | اللاذراعية، غيبة الذراعين الخلقي | کۆڵی، بێ پەلیی زگماك (نەبوونی هەردوو قۆڵ) |
| Abrasion | كشط، سحج، جلف | ڕووشاندن، کڕاندن |
| Abruption | تمزيق، كسر مستعرض | دادڕین، شکاویی گردەبڕ |
| Abruptio Placentae | انفصال السخد | دڕانی ئاوەڵ، جیابوونەوەی ئاوەڵ |
| Abscess | خراج | کوان، دومەڵ، قونێر |
| A. Alveolar | خراج سنخي | دومەڵی کاکیلە، کیسی ددان |
| A. Chronic | خراج مزمن | کۆنە دومەڵ، کوانی کۆن |
| A. Cold | خراج بارد | ساردە دومەڵ، دومەڵی سارد |
| A. Embolic | خراج انحذافي، خراج الضمامي | دومەڵی ئیمبۆڵی، کوێرە دومەڵ |

| | | |
|---|---|---|
| A. Extradural | خراج خارج الجافية | دومەڵی دەرێـی ڕەقـەن، پەردەی دەرێی مێشك |
| A. Intramammary | خراج داخل الثدي | دومەڵی ناو مەمك |
| A. Mammary | خراج الثدي | دومەڵی مەمك |
| A., Phlegmanous | خراج حاد، خراج فلغموني (بلغمي) | تیژە دومەڵ، دومەڵی تیژ، دومەڵی فلگمۆنی (بەڵغەمی) |
| A., Psoas | خراج كشحي | دومەڵی سواس (ماسولكەیەكە) دومەڵی تەنگە، تەنكێش |
| A., Retropharyngeal | خراج خلف البلعوم | دومەڵی پشتگەرو، داگیرسان و هەوكردنی لیمفەلووەكانی پشت و تەنیشتەكانی گەرووە |
| A., Subphrenic | خراج تحت الحاجز | دومەڵی ژێر ناوپەنچك |
| A., Stitch | الخراج الغرزي | دومەڵی شوێن تەقەڵ |
| Abscissa-e | الأحداث الأفقي | هێڵی كەنارەیی، ئابسێسا، تانە هێڵ |
| Abscission | قطع، الأزالة بالقطع | بڕین، لێبڕین، بە بڕین لێكردنەوە |
| Absolute | مطلق، صرف | بێ سنوور، ڕووت، بەرەڵلا، ڕەها |
| Absence | غيبة، غياب | بزربوون، گوم بوون، ونی، لەهۆشخۆچوون(وەك لەكاتی فێدا دەخەوێت بۆ ماوەیەكی كەم) |

| | | |
|---|---|---|
| Absorbent | ماص | مژەر، هەڵمژ، مـژۆك، مـژ، مژە |
| Absorption | امتصاص | هەڵمژین، مژین |
| A. Lines | خطوط فرونهوفر، الخطوط الأمتـصا صـية، خطـوط عموديـة تـرى في الطيـف الشمـسي وصـفها لأول مـرة فرنهوفر | هێڵـەکانی (فراونهۆڤـەر)، مــژە هێڵــەکان، هێڵــی ســتوونین لەشــەبەنگی خـــۆردا دەبینرێـــت، فرانهۆڤەر بـۆ یەکـەم جار وەسفی کرد |
| A. Spectrum | طيف الأمتصاص | شــەبەنگی (ســپێکترۆس) هەڵمژین، مژە شەبەنگ |
| Abstergent | مطهِّر، منظيَف | پاکژکەرە، خاوێنکەرەوە |
| Abstinence | امتناع، تقشف | خۆگرتن، پارێزکردن |
| Abstraction | خلاصة، مستخرج | کورتە، پوختە |
| Abtorsion | انحراف العينين | تیلی، چاو تیلبوون |
| Abulia, Aboulia | نقص الأدارة، فقد الأدارة | بــێ دەســەلاّتی، کــەم دەسەلاّتی |
| Abuse | ســوء الاســتعمال، تفــريط، انتهاك | خـــراپ بـــەکارهێنان، ئەتککردن |
| Acacia | صمغ الأكاسيا، صمغ العربي | کەتیرەی ئەکاسیا، کەتیرەی عەرەبی |
| Acalculia | حبـسة، عـدم قابليـة اجـراء عمليـات حـسابية بـسيطة لخلل عقلـي او حالـة تـسمم (كالتـسمم بأحـادى أوكـسيد الكربون | ئـەکالکولیا، بـێ دەسـەلاّتی یـــاخود بـــێ توانـــایی جێبـــەجێکردنی ســـووکە ژمارەکـــاری، هۆشـــە ناتـــەواوی یـــان بـــە |

| | | |
|---|---|---|
| | | یەکۆکسیدی کاربۆن ژاراویبوون |
| Acampsia | عدم قابلیة طرف من الاطراف للأنثناء | جەمامبوون، نەنوشتانەوەی پەلێك لە جمگەدا، نەچەمینەوە |
| Acantha | شوکة، نتوء فقري، العمود الفقري | درك، چقڵی بربڕاگەیەك، بربڕەی پشت |
| Acanthesthesia | حس شوکي، حس الوخز | درکە هەست، ئاژنەهەست، هەستی پیا چەقین |
| Acantho | بادئة تعني شوکي او ذو علاقة بالشوك | پێشگرێك (پێش بەستێك) بەمانای درك وەیا پەیوەند بە درکەوە |
| Acanthocephala | شوکیات الرأس، دیدان طفیفة شوکیة الرأس | درك بەسەرە، سەر دڕکاوی، تیرەیەکە لە کرمی درك بە سەر |
| Acanthocheilonea perstans | الحبلیات الشوکیة | درکە پەتکەمەنییەکان |
| Acanthosis | تضخم او کثافة الطبقة الشوکیة للجلد | ئەستوور بوونی درکە چینی پێست، ئەکەنتوز |
| A capite ad calcem | من الرأس حتى القدم | لەسەرەوە تا کەڵەنگوستی پێ، سەرتاپا |
| Acapnia | نقص ثنائي اکسید الکربون في الدم | کەمبوونی دوانۆکسیدی کاربۆن لە خوێندا، ئەکاپنیا |
| Acardia | اللاقلبي | بێ دڵی (جانەوەری بێ دڵ)، بە زگماکی نەبوونی دڵ |

| | | |
|---|---|---|
| Acardiotrophia | ضمور القلب | پووكانەوەی دڵ |
| Acariasis | داء الحلم، الجرب أي مرض يسببه القراده | دەردە زچ، زچ تێدان، هەر نەخۆشیەك هۆكەی زچ بێت |
| Acarus | حلمة، قراده | زچێك، گەنەیەك |
| A. Scabiei | حلمة الجرب | زچی گەڕی |
| Acaudal, Acaudate | عديم الذنب | بێ كلك، كوڵ |
| Accelerans Nerve | العصب المسرع للقلب | دەماری دڵ خێراكەرە |
| Acceleration | التسرع، تسارع، تعجيل | خێرابوون، گورجیەتی، لەز |
| Accentuation | تنبير، اشتداد، تضخيم | روون بوونەوە، باشتر بە دیار كەوتن، توندكردن (بوون) |
| Access | نوبة (مرض)، بداية او استهل المرض | سەرەتای نەخۆشی، داگرتن(ی نەخۆشی) |
| Accessory | ملحق، اضافي، مساعد | پاشكۆ، پاشەك، یەدەگ، یارمەتیدەر: پاشكۆ وەیا یاریدەدەری شتێكی تری گرنگتر لەخۆ |
| A. Gland | غدة لاحقة | پاشكۆ لوو، یەدەگ، پەیوەند |
| A. Nerve | العصب الحادي عشر (العصب اللاحق) | دەماری یانزەهەم (ڕەگە پاشكۆ) |
| Accident | حادثة، عارض، طاريء | رووداو، قەوماو، بەسەرهات، ڕێكەوت (لەناكاودا) |

| | | |
|---|---|---|
| Accidental | عرضي، مصادفة | هەڵکەوت، ڕێکەوت |
| A. Abortion | اجهاض طاريء | لەبارچـــوونی ڕێکـــەوت (ناکاو) |
| A. Hemorrhage | نزف طاريء، نزف عارضي | ناکـــاوە خوێنبـــەربوون (لـــەپێش وەختـــدا لێ جیابوونەوەی ئاوەڵ) |
| Acclimatation, Acclimation | التأقلم | پێ ڕاهاتن، لەگەڵ گونجان |
| Acclimatization | التكيف لمناخ | ڕاهێنـان (بـە ئـاو و هـەوا ڕاهاتن) |
| Accommodation | التكيـف، الملائمـة، تكييـف العين | کـۆك کـردن، چـاو کـۆك بـوون، کـۆك کردنـی - بەتایبـەتی چـاوان - بـۆ بینینـــی لـــەماوەی جیاوازەوە |
| A. Absolute | التكيـف المطلق (تكيـف كـل عين على حدة) | کۆکی ڕەها (هەر چاوێك بە جیاواز) |
| A. of the Eye | تكيف العين | چـاوکۆك بـوون، چـاوکۆك کردن، چاو ڕاهێنان |
| A., Positive | التكيـف الايجـابي (للنقطـة القريبـة بـتقلص العـضلة الهدبية) | چـــاوکۆك کـــردن (بـــە بـــەکارهێنانی ماســـولکە برژانگە)، چاو ڕاهێنان |
| Accouchement | ولادة، نفاس | مندالّ بوون، زاین، زایشت |
| Accoucheur | مولد (طبيب) | پزیـــشکی ژنـــان ( بـــۆ مندالّبوون) |
| Accoucheuse | قابلة، داية | مامان |

| | | |
|---|---|---|
| Accretion | نمو طبيعي، ازدياد | هەڵـچوون، گـەورە بـوون (بە شێوەیەکی سروشـتی)، فراژی بوون |
| Accumulation | تراكم، تجمع | کەڵەکەبوون، کۆبوونەوە |
| Accuracy | ضبط، صحة، اتقان | دەق، ڕاستی، دروستی، بـێ هەڵەیی |
| Acedia | السوداء، كآبة، فتور | دڵتـەنگی، دۆڕدامـان، سـاردی، دۆشـدامان، خەمۆکی |
| Acelious, acoelious | عديم البطن، لابطني | بـێ سـك، بـێ زگ، لاواز و باریك |
| A.C.E. Mixture | مـزيج أي. سـي. إي: مـزيج مخدر من جزء من الكحول و جـزئين مـن الكلوروفـورم وثلاثة اجزاء من الاثير | تێکەڵەی ئەی، سی، ئی، بۆ بـەنج کـردن بـەکاردێت، بریتییـە لـە بەشـێك ئـەلکهول، دوبـەش کلۆرۆفـۆرم و سـێ بـەش ئیسەر |
| Acentric | لامركزي، حافوي | دەرکەنار، پەڕ، تەرییك |
| Acephalous | عديم الرأس | بێ سەرە (زگماك) |
| Acephalia | اللارأسـية، غيبـة الـرأس الخلقي | بێ سەری (زگماك) |
| Aceratosis | نقص التقرن، انعدام النسيج القرني | شاخێن کـەمی، کـەمیی بـە شـاخ بـوون، بـێ چـنراوی شـاخیەتی، نـەبوونی شاخەشانە |
| Acescence | خلال، حموضة خفيفة | مزری، ترشییەکی کەم |

| | | |
|---|---|---|
| Aceta | محاليل خلية | سركاوی (گیراوەی سرکە) |
| Acetabular | حُقي | دەفرۆكەيی |
| Acetabulum | الحُق | دەفرۆكە |
| Acetaldehyde | الاستيالديهايد، الألديهايد الأعتيادي $C_2H_4O$ | ئاستيالْديهايد، ئەڵديهايدی ئاسايی، $C_2H_4O$ |
| Acetamide | استيامايد، مذيب اجود من الأمونيا أو الماء | ئەستيامايد، لە ئامۆنيا و ئاو باشتر دەتوێنێتەوە، توێنەرەوەيەكی لە ئاو و ئەمۆنيا باشترە |
| Acetone | الأسيتون، خلون، دايميثيل كيتون | ئەسيتۆن، دايمێثيل كيتۆن، دوانە مەثيل كيتۆن |
| Acetone Bodies | الأجسام الخلونية، عبارة تستعمل في الطب السريري للدلالة على حامض الهيدروكسي بيوتيرى والحامض الأسيتواستيتي الخلون بصورة عامة والتي لها دخل في الحامض السكري | تەنەئاسيتۆنييەكان، لە پزيشكيدا ترشی هايدرۆكسی بيوتيری و ترشی ئاسيتۆئەسيتی و ئاسيتۆن دەگرێتەوە كە لە ترش بوونی شەكرەترشدا بەشداری دەكەن |
| Acetonuria | بيلة خلونية | ئەسيتۆن يوريا، ئەسيتۆن لە ميزدا |
| Acetum | الخل | سركە |
| Acetylene | استلين ($C_2H_2$) غاز له رائحة الثوم وعديم اللون | ئاسيتلين ($C_2H_2$) گازێكە بۆنی سيری هەيە و بێ ڕەنگە |
| Acetylsalycilic Acid | الأسبرين، حامض خليل الساليسيلك | ئەسپرين، ترش ئەسيتيل ساليسليك |

| | | |
|---|---|---|
| Achalasia (Cardiospasm) | اكالازيا، قبب المريء | اكالازيا، جەمامبوون، بەگیر وەستان |
| Ache | الم (ثابت ومستقر)، وجع | ئێش، ئازار، ژان |
| Acheilia | فقد الشفة (انعدام الشفتين الخلقي) | بێ لێوی (نەبوونی لێو و لچ بە زگماکی)، بێ لچی، بێ لچو لێوی |
| Acheiria | انعدام اليدين الولادي | بێ دەستی (زگماك) |
| Achilles Tendon | وتر أخيل، وتر الدابرة | ژێی ئاشیل، ژێی پاژنەپێ |
| Achilliodynia | الم وتر الدابرة | ژانی ژێی ئاشیل |
| Achlorhydria | اللاحموضية | بێ ترشی، ترشی هایدرۆكلۆریك نەبوون لە گەدەدا |
| Achloropsia | عمى اللون الأخضر | سەوزی نەبینین، كوێری بۆ ڕەنگی سەوز، سەوزە كوێری |
| Acholia | اللاصفراوية | بێ زراوی، کەمی یان نەبوونی زراو |
| Acholuria | بيلة لاصفراوية | ئەکۆل یوریا، نەبوونی زەرداو لە میزدا، میزی بێ زەرداو |
| Achondroplasia | القماءة | ئەكۆندرۆپلاسیا، گرگنەیی |
| Achordal, Achordate | لاحبلي، عديم الحبل الظهري | بێ پەتی، بێ پەتی بڕبڕە |
| Achorion | اكوريون، جنس من فطريات الجلد | ئەكۆریۆن، جۆرێکی کەڕوی پێستە |

| | | |
|---|---|---|
| A. Keratophagus | فطر الأظافر | کەڕوی نینۆك، نینۆکخۆره |
| A. Schoenleinii | اكوريون شونلاين، فطر السعفة | ئەکۆریونی شونلاین، کەڕوی کەچەڵی |
| Achroma | فقد اللون، شحوب | بێڕەنگی، کاڵبوونەوە، کاڵی |
| Achromachia | ابيضاض الشعر | مووسپیبوون، قژ سپی بوون |
| Achromatic | لالوني، فاقد اللون | بێ ڕەنگ، ڕەنگ نەماو |
| Achromatism | لالونية، انعدام اللون | بێ ڕەنگ، بێ ڕەنگێت، ئەکرۆماتیزم |
| Achromatopsia, Color-blindhess | عمى الألوان | کوێری ڕەنگ، ڕەنگنەبینی، ڕەنگ کوێری |
| Achromotrichia | غيبة اللون من الشعر، زوال لون الشعر | بێ ڕەنگی موو، بێ ڕەنگبوونی موو |
| Achylia | اللاكيلوسية، عدم الكيلوس | ئێکایلیا، بێکیمۆسی |
| Achymosis | اللاكيموسية، عدم الكيموس | ئیکایمۆس، کیمۆس نەبوون |
| Acicular | إبري، إبري الشكل | وەك دەرزی، لە شێوەی دەرزیدا، دەرزی ئاسا |
| Acid, Acids | حامض، حوامض | ترش، ترشەکان |
| A., acetic | حامض الخليك | ترشی سرکە |
| A., Acetylsalycilic | حامض خليك الساليسلي | ترشی ئەسیتیل سالیسیلیك، اسپرین |
| A., Diacetic | حامض الخل الثنائي | ترشی دوانە سرکی (سرکەی جووت) |

| | | |
|---|---|---|
| A., Amino | الحوامض الآمينية | ئەمینۆترشەکان |
| A., Benzoic | حمض الجاوي $C_7H_6O_7$ | ترشی بەنزۆیك. $C_7H_6O_7$ |
| A., Boracic or Boric | حامض البوريك $H_3BO_3$ | ترشی بۆراسیك $H_3BO_3$ |
| A., Bromic | حامض البروميك $HBrO_3$ | ترشی برۆمیك $HBrO_3$ |
| A., Butyric | حامض البيوتيريك $C_4H_8O_2$ | ترشی بیوتیریك $C_4H_8O_2$ |
| A., Capric | حامض الكابريك $C_{10}H_{20}O_2$ | ترشی کاپریك $C_{10}H_{20}O_2$ |
| A., Carbolic | حامض الكربوليك $C_6H_6O$ | ترشی کاربۆلیك $C_6H_6O$ |
| A., Carbonic | حامض الكربون $H_2CO_3$ | ترشی کاربۆن، ترشی دوانۆکسیدی کاربۆن $H_2CO_3$ |
| A., Chromic | حامض الكروم $H_2CrO_4$ | ترشی کرۆمیك $H_2CrO_4$ |
| A., Citric | حامض الليمون $C_6H_7O_8$ | ترشی لیمۆ $C_6H_7O_8$ |
| A., Diacetic | حامض الخل الثنائي | ترشی دوانە سرکی |
| A., Cyanic | حامض السياني CNOH | ترشی سیانیك CNOH |
| A., Formic | حامض النمليك $CH_2O_3$ | ترشی فۆرمیك (مێرولە) $CH_2O_3$ |

| | | |
|---|---|---|
| A., Hippuric | حـــــامض بـــــول الخيـــــل $C_9H_9NO_3$ | ترشی هیپوریك (له میزی چـوار پـێ گیاخۆرەکانـدا دەبێت) |
| A., Hydrochloric | حامض الايدروكلوريك HCl | ترشـی هایـدرۆکلۆریك HCl |
| A., Hydrocyanic | حـــامض الأيدروســـيانيك HCN | ترشـی هایدرۆسـیانیك HeN |
| A., Hydrofluoric | حامض الايدروفلوريك HF | ترشی هایدرۆفلۆریك HF |
| A., Hydrosulfuric | كبريتيد الهيدروجين $H_2S$ | ترشـی هایـدرۆگۆگردیك، ترشـی هایدرۆسـلفریك، گـــازی گۆگردیـــدی هایدرۆجین $H_2S$ |
| A., Malic | حامض التفاح $C_4H_6O_5$ | ترشی سێو، ترشی مالیك $C_4H_6O_5$ |
| A., Nicotinic | حـــامض النيكوتينيـــك $C_6H_5NO_2$ | ترشـــی نیکۆتینیـــك $C_6H_5NO_2$ |
| A., Nitric | حامض النيتريك $HNO_3$ | ترشی نیتریك $HNO_3$ |
| A., Nitrosonitric | حامض النتريك المدخن | ترشی نیتریکی دووکەڵدار |
| A., Nucleic or Nucleinic | حامض النوين $C_{18}H_{34}O_2$ | ترشـی نیوکیلییـك یـان نیوکلینیـك، ترشـی نـاوکی $C_{18}H_{34}O_2$ |
| A., Osmic | حامض الأوسميك $O_5O_4$ | ترشی ئۆزمیك $O_5O_4$ |
| A., Oxalic | حـــامض الأوكـــساليك $C_2H_2O_4+2H_2O$ | ترشـــی ئۆگزالیـــك $C_2H_2O_4+2H_2O$ |
| A., Palmitic | حامض الثالتيكي $C_{16}H_{32}O_2$ | ترشـــی پاڵمیتیـــك $C_{16}H_{32}O_2$ |

| | | |
|---|---|---|
| A., Parmanganic | حامض الترمنيكي $HMnO_4$ | ترشـى پرمەنگـەنيك $HMnO_4$ |
| A., Phosphoric | حامض الفسفوريك $H_3PO_4$ | ترشى فسفۆريك $H_3PO_4$ |
| A., Phosphotungstic | حامض الفسفوتنغستيك | ترشى فوسفوتەنگەستيك |
| A., Prussic, HCN | حـامض البـروسـيكي = الايدروسيانيكي | ترشـى پرووسـى = هايدرۆسيانيك |
| A., Pyrogallic | حـامض الحفـص النـاري $C_6H_6O_3$ | ترشـى پاريرۆگاليـك $C_6H_6O_3$ |
| A., Pyroligneous | حامض الخل الخشبي | ترشـى پـايرۆليگنيۆس، دارەترشـى سـركە، ليگنيۆس |
| A., Pyruvic | حامض البيروفيك | ترشى پايروڤيك |
| A., Succinic | حـامض الكهربـاء، حـامض السكسيت $C_4H_6O_4$ | ترشـى كارەبـا، ترشـى سەكسينيك $C_4H_6O_4$ |
| A., Sulfuric (Sulphuric) | حامض الكبريتيك $H_2SO_4$ | ترشـى گۆگرديـك، گۆگرديك $H_2SO_4$ |
| A., Tartaric | حامض الطرطر $C_4H_4O_6$ | ترشـى تارتاريـك $C_4H_4O_6$ |
| A., Trichloracetic | حامض الخل الثلاثي الكلور $C_2HC_{13}O_2$ | ترشى سيانە كلۆرۆسركى $C_2HC_{13}O_2$ |
| A., Uric | حامض البول $C_5H_4N_4O_3$ | ترشـى يوريـك (ميـز) $C_5H_4N_4O_3$ |
| Acidalbumic | زلال حامض | ترشە ئالبومين |
| Acidemia | دم حمـضي، حمـضنة الـدم، حالـة مـن الحـالات الـدم تقل | خوێنترشـى، خـوێنترش بـوون، بـارێكى خوێنـە |

| | | |
|---|---|---|
| | فيها قلويتها | ترشی تێدا زۆر دەبێت |
| Acidifiable | قابل للتحميض او الحمضنة | دەشێ ترش بکرێت، ترشۆکی |
| Acidimeter | مقياس الحموضة، المحماض | ترشی پێو، ئامێرێکە بۆ پێوانی پاکژیی ترشەکان بەکاردەهێنرێت |
| Acidity | حموضة، حامضية | ترشیی، ترشێەتی، ترشایی |
| Acidocytosis | | ئاسیدۆسیتوزز، زۆربوونی خرۆکەی ئایۆزۆنۆفی |
| Acidophile | محب الحمض، ولوع بالحمضية | ترشخواز، حەز لە ترشی کەرە |
| Acidosis | حماض، تسمم بالحوامض ينتج من الانتاج الغير الطبيعي للحوامض داخل الجسم وعدم التخلص منها بصورة صحيحة | ئاسیدۆزز، ترشۆزە ژاراوی بوون (تسمم) (ترشە ژەهراویبوون) بەترشی لەبەر زۆری پەیدابوونی لەناو لەشدا و خراپ دەرکردنە دەرەوەی |
| Acidulate | يستحمض | ترش کردن، مزر کردن |
| Acidulous | حامض قليلاً | مزر، کەمترش |
| Acidum | حامض، احد الحوامض | ترشێك، ترش |
| Aciduria | بيله حمضية | ترشە میز، میزە ترشێ |
| Acini | عنبات، جمع عنبة | دەنکە ترێ، ترێ |
| Aciniform | عنبي الشكل | ترێیی، هێشویی |
| Acinose or Acinous | عنبي | ترێیی، هێشویی |

| | | |
|---|---|---|
| Aclastic, Not refracting | لاكاسر، غير كاسر (للنور...الخ) | نەشكێتەوە ( بۆ رووناکی، تیشك) |
| Acme | ذروة، قمة، برحاء | پۆپ، پۆپە، تەوقەسەر، بەرزترین خاڵ |
| Acne | العُد | زیپکە، قنچکەی عازەبە، زیپکەی عازەبە |
| A., albida, milium | العُد الدخني | زیپکەی کزنی، قنچکەی وردی کزنی هەبێت |
| A., disseminate | العُد المنتشر | زیپکەی پەرت (پەرش)ی بلاّو |
| A. Keloid | العُد الجُدري | زیپکەی گۆشتپارەیی |
| A. Keratosa | العُد التقرني | زیپکەی شاخی |
| A. mentagra, Barbers itch | قوباء الذقن | دەردەچەنە |
| A. vulgaris | العد العادي ـ حب الشباب | عازەبەی هەرزەکاری |
| Acniform | عدی الشكل | عازەبەیی، زیپکەیی |
| Acnemia | خمور عضلات= الرباتين (بطن الساق) | ئەکنیمیا، لاوازبوون و باریك بوونی ماسولکەکانی پووز |
| Acoelious | عديم البطن، لابطني | بێ سك، بێ زگ |
| Acognosia | معرفة الأدوية | دەرماناسی (دەرمان شناسی) |
| Acology | علم الأدوية | دەرمانزانی، زانستی دەرمان، زانیاری دەرمان |

| | | |
|---|---|---|
| Acomia, baldmen | الصلع | بێ تووکی، بێ موویی، لووس |
| Aconitum | اقونيط، خانق الذئب، نوع من الاعشاب تستعمل الجذور والاوراق لغايات علاجية | ئاکۆنیت، جۆرە گیایەکە رەگ و گەلاکانی ژەهراوین وە لە پزیشکیدا بۆ چارەکردنی هەندێ ناساغی بەکاردەهێنرێت |
| Aconuresis | إبالة لاارادية | میز ڕانەگرتن |
| Acoria | النهم، عدم الشبع | چلێسی، تێرنەخۆری، هەمیشە برسێتی، تێرنەخواردن، تێر نەبوون |
| Acorea | فقد البؤبؤ (ولادي) | بێ بیبیلەیی (زگماك) |
| Acou- | بادئة بمعنى السمع | پێشگرێکە بە واتای بیستن |
| Acoulalion | جهاز سمعي نطقي لتعليم التكلم للخرس البكم | ئەکۆلالیۆن، ئامێرێکە کەڕ و لاڵی پێ فێری ئاخافتن دەکرێت |
| Acoumeter | مقياس السمع | بیستنپێو، گوێ سووکی پێوانەکردن |
| Acoustic | سمعي، صوتي، ذو علاقة بالصوت، بالسمع او الاذن | بیستۆکی، دەنگی، پەیوەند بە دەنگ، بە گوێ یا بە بیستنەوە |
| Acoustic area | الباحة السمعية | ناوچەی بیستن (لە مێشکدا) |
| Acoustic nerve | العصب السمعي | دەماری گوێ لێبوون، دەماری بیستن |

| | | |
|---|---|---|
| Acoustic neuroma | ورم العصب السمعي | نێۆرۆمای دەماری بیستن، پەنامی ڕەگی (دەماری) بیستن |
| Acoustics | علم الاصوات والسماع | زانیاری دەنگ و بیستن، دەنگزانی، بیستنزانی |
| Acquired | مكتسب | وەرگیراو، دەسکەوتە (پێچەوانەی بۆماوە، ڕەچەڵەکی) |
| Acra-, Acro- | بادئة معناها طرف، ذروة، نهاية | پێشگرێکە بەمانای پەل، پۆپە، لووتکە، ترۆپك |
| Acral | متعلق بالأطراف | پەلی، پەیوەند، بە پەلەكانەوە |
| Acrania | غيبة الجمجمة (ولادي)، اللاقحفية | ئەکرانیا، نەبوونی تەواوی یان هەندێك لە كاسە سەر، بێ كاپۆڵ |
| Acraturesis | عجز التبول، عدم التمكن من التبول بسبب استرخاء او وهن المثانة | میز پێ نەکران، بێ دەسەڵاتی میز کردن لەبەر شلی و بێ هێزی میزڵدان |
| Acrid | لاذع، حريف | تیژ، توون |
| Acrinia, | اللاإفراز، التوقف من الأفراز | دەردان نەکردن، دەرنەدان، لە دەردان وەستانەوە |
| Acrasia | سلس (عدم استمساك)، هزال | خۆ ڕانەگرتن، لاوازی، بێهێزی |
| Acritical, Without crisis | عديم الجران | بێ کریز |

| | | |
|---|---|---|
| Acro- | بادئة بمعنى الطرف، نهاية، ذروة | پێشگرێكه بەواتای پەل، سەر، لووتكه، پۆپه |
| Acroanesthesia | خدر نهايات الأطراف، خدر الأطراف | دەستوپێ سڕبوون، دەستوپێ سڕێ، چوارپەل سڕێ |
| Acroarthritis | رثية الأطراف | داگیرسانی جمگەی پەلەكان (چوار پەل) |
| Acroasphyxia | اختناق الأطراف | دەستوپێ تاسان، ئەسفیكسیای چوارپەل (پەلەكان)، پەنجە شینبوونەوە |
| Acrocephalia | مخروطية الجمجمة | سەردرێژكۆلەیی (قووچەكێتی سەر) |
| Acrocyanosis | زراق الأطراف | دەستوپێ شینبوونەوە، چوارپەل شینبوونەوە |
| Acroesthesia | وجع الأطراف، زيادة حساسية الأطراف | ژانی دەستوپێ، زۆر هەستیاربوونی چوارپەل |
| Acromania | جنة شديدة | شێتی بێ دەرمان، پەتەرێتی، شێتی پەتەری |
| Acromastitis | التهاب حلمة الثدي | هەوكردنی (داگیرسانی گۆی مەمك، داگیرسانی چیچك |
| Acromegaly | ضخامة الأطراف | دەستوپێ زلی، ئەكرۆمێگالی |
| Acromicria | صغر الأطراف ـ اليدين والقدمين | دەستوپێ بچووكی، چوارپەل وردی |
| Acromion | الأخرُم، قمة الكتف | تەوقی شان، سەرشان |

| | | |
|---|---|---|
| Acroparalysis | شلل الأطراف | شـــــەپلەی دەســــــتوپێ (چـــوارپەل)، شــــەپلەی چوارپەل |
| Acroparesthesia | تنمل الأطراف | دەســــــتوپێ تـــــەزین (میرولـەکردن)، چـوارپەل تەزین |
| Acrophobia | رهبة المرتفعات | بەرزیترسێ، بەرزاییترسـێ، جـۆرە ترسـێکە دەنیـشێتە دڵـی هەنـدێ کەسـان کـە دەچنە شوێنی بەرز |
| Acroposthisis | التهاب القلفة | هـــەوکردنی (داگیرســـانی) چەرمی کێر |
| Acrosphacelus | مــوات الأصـــابع، غانغرينـــا الأصابع | کـــانگرینی پەنجــــەکان، نەخۆشی (رینۆ) |
| Acrotism | ضعف النبض او فقده | ترپەکزێ یان بێ ترپەیی |
| ACTH | أ.ســی. تـــی. اتـــش، الهرمـــون الكظري القشري | ئـــەی. ســـی. تـــی. ئـــێچ، هۆرمـــۆنی توێکڵـــە لـــووی سەر گورچیلە |
| Actinic | اكتيني، شعاعي، المقـدرة على إثارة التفاعل الكيماوي | کـارایی، تیـشکی، توانـستی هاندانی کارلێکی کیمیایی |
| Actinism | الأكتينيــــــــة، الخاصــــــــية الكيمياوية للضوء | کـارایی، ڕەوشـیی کیمیـایی ڕووناکی |
| Actinodermatitis | التهاب الجلد الشعاعي | تیشکە داگیرسانی پێست |
| Actinogenic | مولد الأشعة | تیشك دروستکەرە |

| | | |
|---|---|---|
| Actinology | الأكتنولوجيا، علم أشعة الضوء وخاصة من حيث آثارها الكيمياوية | ئەکتینۆلۆجی، تیشکە رووناکیزانی بەتایبەتی لە بابەت کاریگەرییە کیمیاییەکانیەوە |
| Actinomycosis | داء الفطر الشعاعي | اکتینومایکۆز، تووشی دەردی جۆرە کەڕویەکی تیشکداربوون، دەردەتیشکە کەڕو |
| Actinotherapy | العلاج بالأشعة (الفوق البنفسجية) | بە تیشك چارەکردن، اکتینوتیراپی (بە تیشکی ژوور وەنەوشە)، تیشکە چارە (ژوور بنەوشەیی) |
| Action | فعل، حدث | کردار، کردن |
| A. Reflex | فعل انعكاسي | پەرچە کردار، کارێکی انعکاسی، بەبێ دەستەلاّت و بە زەبر و لە تاوی ڕەگەکان بەشێك وەیا یەکێ لە ئەندامەکانی لەش بکەوێتە کار وەیا جووله |
| Active | فاعل، نشيط | کارا، بزێو، کاربین، کارامە، چالاك |
| Activate | تنشيط | کارا کردنەوە، گورج کردنەوە، چالاك کردنەوە |
| Activity | نشاط، فاعلية | کارایی، چالاکی، بزێوی، بەکاری، کاربینی |

| | | |
|---|---|---|
| A. Radio | النشاط الأشعاعي | تیشکە چالاکی، تیشکە کارایی |
| Actual | فعلي، حقيقي | بەڕاستی، ڕاستینە |
| Actual Cautery | كاوية | ئاسنێکی سوورکراوە بۆ داخ کردن بەکاردەهێنرێت، داخکەرە |
| Acuity | حدة | تیژی |
| A. Visual | حدة البصر | تیژیی چاو، چاو تیژی |
| Acumen | فطنة | دانایی، تێگەیشتن |
| Acuminate | مستدق | تیژ، نووکتیژ، نۆکدار |
| Acupuncture | النخز او الغرز الأبري | دەرزی ئاژن کردن، دەرزی پیاکردن |
| Acus | ابرة، ابرة جراحية | دەرزی، دەرزی برینکاری |
| Acutenaculum, Needle holder | مقبض الأبرة | دەرزیگرە |
| Acusection | القطع الأبري ـ بالأبرة الكهربائية | بە دەرزی کارەبایی بڕین، ئیکیوسیکشن |
| Acusticus | العصب السمعي | دەماری بیستن |
| Acute | حاد، شديد، قاس | تیژ، توند، خێرا، گورج، بەتاو، سەخت |
| Acute Disease | مرض حاد (قصير الأمد عنيف الأعراض) | ناساغی تیژ (لە پڕ و کورت و بەتین) |
| Acuteness | حدة | تیژی، سووکی (گوێ) |
| Acyanoblepsia, | عمى الازرق | شینکوێری، شین نەبین، |

| | | |
|---|---|---|
| Acyanopsia | | کوێری شین، ڕەنگی شین نەزانین |
| Acyesis | عقم نسائي، عقم | نەزۆکی |
| Acystonervia | شلل المثانة | شەپلەی میزڵدان، ئیفلیجی میزڵدان |
| Adacria | عدم الدمع | کەم فرمێسکی، بێ فرمێسکی |
| Adactylia | فقد الأصابع | بێ پەنجەیی، بێ ئەموستی، بێ تلی |
| Adam's Apple, Pomum adami | الحرقدة، تفاحة آدم، عقدة الحنجرة | قورتم، سێوی ئادەم |
| Adams-Stokes, Syndrome or disease | مرض أو لزمة آدمز - ستوكس، لزمة مرضية تتكون من تباطوء في ضربات القلب المصحوب بنوبات صرع | نەخۆشی ئادامز - ستۆکی، نیشانەیەکە بە هێواش (کەم) لێدانی دڵ و فێ لێ هاتن دیاری دەدات |
| Adaptation | ملاءمة، تكييف | کۆك بوون، خۆ ڕاهێنان، ڕێك کەوتنی بیلبیلەی چاو (کرانە و داخستن) بەگوێرەی کەم و زۆری ڕووناکی، خۆ گونجاندن |
| Adamantinoma | ورم مينائي | ئەدامانتینۆما، میناپەنام |
| Addict | مدمن | ئالوودە، دووچار، خوو پێوەگرتوو |
| Addiction | ادمان | دووچاری، خووپێوەگرتن، بەخوو کردن، ئالوودە بوون |
| Additional | أضافي | زیاد، پاشکۆ، سەربار |

| | | |
|---|---|---|
| Addison's Anemia | شحاب اديسون، الفقر الدم الخبيث | کەمخوێنی ئەدیسۆن، پیسە کەمخوێنی |
| Addison's Disease | مرض اديسون، ويتميز بالهزال والوهن الشديد وتلون الجلد ينشأ من اضطراب في الغدة الكظرية | دەردی ئەدیسۆن، نەخۆشی ئەدیسۆن، بە باریك و بنێسی و بێهێزی و رەنگرتنی پێست لە پەشێویی (شێوانی) سەر گورچیلەلوو (گەدیز)ەوە دەبێت |
| Adduct | يقرب (نحو المحور الرئيسي) | نزیك دەخاتەوە |
| Adduction | تقريب (نحو المحور) | نزیك خستنەوە (بەرەو تەوەرە ـ هێڵی ناوەندی ـ لەش بزواندن) |
| Aden | غدة | لوو، رژێن |
| Adenalgia | ألم الغدة | ژانەلوو، لووئێشە |
| Adendritic | لاغصين | بێ پەل، بێ لق |
| Adenectomy | استئصال الغدة | لووبڕین |
| Adenia | مرض دوجكنس | دەردی دوجکنس |
| Adenitis | التهاب الغدة | لوو هەوکردن، داگیرسانی لوو، لوو ئاوسان، لوو سووتانەوە |
| Adenocarcinoma | سرطان الغدة | ئەدینۆکارسینۆما، قرژاڵەی لوو، پیسەپەنامی لوو |

| | | |
|---|---|---|
| Adenochondroma | سرطان غدي غضروفي | ئەدینۆکۆندرۆما، قرژاڵەی کرکراگە و لوو، |
| Adenoids | زوائد انفية | لووەکی، زیادە گۆشتی لووت (لە منداڵدا دەبێت بە زۆری) |
| Adenolymphoma | سرطان غدي ليمفاوي، سرطان ليمفاوي | ئەدینۆلیمفۆما، قرژاڵەی لیمفەلو، لیمفە قرژاڵە |
| Adenoma | ورم غدي | ئەدینۆما، پەنامی لوو |
| Adenopathy | داء الغدد (مطلق) | دەردە لوو (هەر جۆرێك بێت) نەخۆشی لوو |
| Adeps | دهن او شحم الخنزير | رۆن یان پێویی بەراز |
| Adeps lanae, Lanolin | لانولين، دهن الصوف | لانۆلین، ڕۆنخوری |
| Adermia | غيبة او نقص الجلد | بێ پێستی |
| Adhere | يلتصق | پێوەدەنووسێت، پێوە دەلکێت |
| Adhesion | التصاق | پێوەنووسان، پێوەلکان، نووسان، لکان |
| Adiaphoresis | قلة العرق او عدمه | ئارەق نەکردنەوە، کەم ئارەق کردنەوە، کەمئارەقی یان بێئارەقی |
| Adipocele, Adipocere | فتق يحتوي على النسيج الشحمي، أدرة دهنية، تشحم شمعي | ئەدیپۆسیل، چەورە قۆڕی |
| Adipose | شحم، شحمي | چەور، پیودار، قەڵەو |
| Adiposis | تشحم | قەڵەوی، چەوری، پیونی، |

| | | |
|---|---|---|
| | | بەزگرتن |
| A. dolorosa | التشحم المؤلم | قەڵـــەویی بـــە ئـــازار، قەڵـــــەویی ژانـــــدار، چـەورەگریێ ورد ورد لــە لەشـــدا بلاّودەبنــــەوە و بەژانن |
| Adiposogenitalis | شحمي تناسلي | پیوەزاوزێیی |
| Adipositas cordis | تشحم القلب | دڵە پیوێ، دڵی بـەزگرتوو، پێوبەندی دڵ |
| Adiposuria | بيله شحمية | میـــزی چـــەور، چـــەورە میزێ |
| Adipsia | فقد أو قلة العطش | بێ تینوویێتی، کەم تینـوو بوون، تینوو نەبوون |
| Aditus | مدخل، دهليز | دەرك، دەرگە، زار، دالآن |
| Aditus ad antrum | مدخل الأذن الباطنية، دهليز الأذنية | دەرکـــی گـــوێی نـــاوەوە، دالآنی ناوەوە |
| Adjustment | ضــبط، جهــاز آلــي لرفــع وتنزيل انبوب المجهر | ڕێکخـــــستن، چـــاکردن، ئــامێرێکی میکــانیکی بــۆ بــەرز و نــزم کردنــەوەی لوولەی وردبین |
| Adjuvant | مساعد | یارمەتیــــدەر، ئاریکــــار، یاریدەدەر |
| Adler's Benzidin Reaction for Blood | تفاعل بنزيدين، آدلر لكشف عن وجود الدم، تضاف كمية سي سي واحد من محلول مـائي للـدم الى مـزيج مـن كميات متساوية من محلول | کارلێکی بنزیـدینی ئادلـەر بـۆ خـوێن پـشکنین، یـەك سی سی خوێنـاو دەکرێتـە تێکـــەڵی چـــەند برێکـــی یەکـسان لـە گیراوەیـەکی |

| | | |
|---|---|---|
| | مشبع للبنزدين في الكحول او حامض الخليك الجليدي مع محلـــول بيروكـــسيد الهيـــدروجين (٣٪) حيـــث يتكون لون اخضر او ازرق | تێری بـەنزۆین کـە کهول یـان ترشـی سـرکەی سـەهۆڵی لەگـەڵ گیراوەیـەکی ٣٪ پیرۆکـسیدی (ژووروۆکـسیدی) هایـدرۆجین، ڕەنگێکـی سـەوز یـان شـین پەیـدا دەبێت |
| Adlibitum | بدون قيد، حسب الرغبة | بـەگوێرەی ئـارەزوو، بێسنوور، بە ئارەزوو |
| Adnexa | الملاحق، التوابع | پاشکۆ |
| Adolescence | اليفع، المراهقة | هـەرزەکاری، بزەڵـەیی، گـەنجێتی (لـە تەمـەنی ١٤-٢٥ساڵی دایە) |
| Adolescent | يافع، مراهق | هەرزەکار، بزەڵە، گەنج |
| Adoral | صوب الفم، قريب من الفم | لای دەمـەوە، بـەرەو دەم، نزیکی دەم |
| Adosculation | تحبيـل بالأتـصال الخـارجي، القاح بالتماس | ئاوس کردن، سکپڕ کـردن، بـەبێ جـووت بـوون، بـە لەیەك کەوتن |
| Adrenal | مجاور الكلية، المحفظة الفوق الكلوية، الكظر | نزیـك گورچـیلە، هاوسـێی گورچیلە، ئەدرینالّ، لـووی سەر گورچیلە |
| A.-gland | الكظر | لـووی ئـەدرینالّ (سـەر گورچیلە) |

| | | |
|---|---|---|
| A. cortex | قشرة الكظر | توێکڵی ئەدرینالّ، تویکلّی لووی سەر گورچیلە |
| A. medulla | لب الكظر | کاکڵەی ئەدرینالّ، کاکڵەی لووی سەرگورچیلە |
| Adrenaline | ادرينالين | ئەدرینالین، جەوهەری بەکاری لووی سەرگورچیلە |
| Adrenocorticotrop-hic | مفرز قشرة الكظر الغذائي | خۆراکە هۆرمۆنی هاندەری توێکڵی گورچیلە رژێن |
| Adrenogenital Syndrome | اللزمة الكظرية التناسلية | نیشانە سەر گورچیلەییە زاووزێییەکان |
| Adsorption | امتزاز | روومژین |
| Adult | بالغ، راشد | گەورە، پێگەییو، قراسە |
| Adustion, The application of a burning substance | كي، شواء | داخکردن، داخکردن بە مادەیەکی سووتاو وەیا سوورەوە کراو |
| Advancement | تقديم، عملية لعلاج الحول حيث يغير موضع التحام عضلة عينية بتقديمها واعادة تثبيتها | پێشخستن، جۆرە برینسازییە بۆ چارەکردنی خێلی چاو، یەکێك لە ماسولکەکانی چاو لە شوێن خۆی هەڵدەکەنرێت وە بۆ شوێنێکی تر پێش دەخرێت |
| Adventitia | برانية الوعاء، الطبقة الخارجية للشريان | بەرگی دەری خوێنبەر، تۆیی دەرەوەی دیواری |

| | | |
|---|---|---|
| | | سووره دەمار |
| Aer | الهواء الجوي | هەوا |
| Aeration | تهوية | باوەشێن کردن، هەوا گۆڕکێ |
| Aerendocardia | استهواء القلب، وجود الغاز او الهواء داخل القلب | با تێچوونی دڵ، با چوونە دڵ، با یا گاز چوونە ناو دڵەوە |
| Aerhemoctonia | الموت بدخول الهواء إلى الأوردة | مردن بە با چوونە ناو شینە دەمار (خوێنهێن) |
| Aerobe | ميكروب الحَيهوائي، ميكروب لايعيش الا بوجود الأوكسجين | ئێروب، میکرۆبی زیندەبا، میکرۆبێك کە بەبێ هەوا هەڵ نەکات (نەژی) |
| Aerobiosis | الحيهوائية، الحياة بوجود الهواء | ئێروبیوسس، زیندەبایی، بەبێ هەوا (ئۆکسجین) هەڵ نەکردن (نەژیان) |
| Aerocolpos | انتفاخ المهبل، توسع وانتفاخ المهبل بالهواء | کوز با کردن، پڕبوونی کیلك لە با و ئاوسانی |
| Aerocystoscopy | تنظير المثانة الهوائي | پشکنینی میزڵدان بە پڕکردنی لە هەوا و سەیری ناوەوەی کردنی |
| Aerodontalgia | وجع الاسنان الهوائي | ددان ئێشەی بەرزایی |
| Aerodynamics | الأيروديناميات، علم التحركات الغازية والقوى التي تحركها و نتائجها | ئێرۆدینامیکس، زانیاری جوڵانەوەی گازەکان و هۆ و ئەنجامی |
| Aerogram | رسالة جوية، رسم شعاعي لعضو نفخ بغاز | ئێرۆگرام، تیشکە وێنەیەکی ئەندامی بە گاز |

| | | |
|---|---|---|
| | | فوو كردن |
| Aeromedicine | طب الطيران | پزیشکیی فرینەوانی |
| Aerometer | مكثاف الغازات، جهاز لقياس كثافة الغازات | چڕیی هەواپێو، ئامێرێکە بۆ پێوانی سفتیی هەوا |
| Aero-otitis-media | التهاب الأذن الهوائي، أصابة طبلة الطيارين بسبب تغير الضغط الجوي خلال الطيران | هەوکردنی (داگیرسانی) گوێچکەی هەوایی کە تووشی فڕۆکەوان دەبێت لەکاتی فڕیندا |
| Aeropathy, Caisson's Disease | مرض كيسون | ناساغیی کەیسۆن |
| aerophagy | بلع الهواء | هەوا قووتدان، قڕقێنە |
| Aerophobia | رهبة الهواء (الخوف من التيارات الهوائية) | نەخۆشی هەواترسێ، باترسێ لە با ترسان |
| Aeroscope | منظار هوائي (جهاز لفحص نقاوة الهواء من الغبار) | ئێرۆسکۆپی هەوابین، ئامێرێکە بۆ تاقی کردنەوەی پاکیی هەوا لە تەپوتۆز |
| Aerosol | رذوذ | ئێرۆزۆڵ |
| Aerosol-therapy | ارذاذ | چارەکردن بە ئێرۆزۆڵ |
| Aerostatics | علم توازن الغازات، علم نواميس الهواء الساكن | ئێرۆستاتیکس، هاوسەنگیگاززانی، زانیاری یاساکانی لەنگەرگرتنی گازەکان، گازی مەنگ، |

| | | |
|---|---|---|
| Aerotherapeutics, Aerotherapy | المداواة بالهواء | بــه هــەوا چــارەکردن، بــەکارهێنانی هــەوا لــە چارەکردنی نەخۆشیدا |
| Aerothorax | استرواح صدري | ئێرۆپسۆراکس، با چوونە ناو سنگ |
| Aerotonometer | مقياس ضغط الغازات في الدم | ئێرۆتۆنۆمیتــــــــــەر، پەســــتانپێوی خــــوێن، ئامێرێکە بۆ پێوانـەکردنی تــاوی گازەکــان لــەناو خوێندا |
| Aetiology | الأسباب، مبحث اسباب المرض | هــۆزانی، هــۆ، زانــستی هۆیەکانی نەخۆشی |
| Afebrile | لاحموي | بیٚ تا |
| Affection | آفة، علة، إصابة | دەرد، دووچـــــــاربوون، تووشبوون |
| Afferent | وارد | هێنەر |
| Affinity | الفة، مجاذبة، ميل | حەز، هـۆگری، پەیوەنـدی، یەکتری کێش کردن |
| A. Chemical | ألفة كيمياوية | هــۆگری کیمیــایی، ئــەو هێزەی جۆرە شتی جیـاواز پێکــەوە دەنێــت بــۆ پێکهێنانی ئاوێتەی تازە |
| Afibrinogenaemia | اللاليفينية | خوێنەبێرپــــــــشالزانی، نـەبوونی فـایبرینۆجین لـە خوێنــدا، خــوێنی بــێ فایبرینۆجین |

| | | |
|---|---|---|
| Afflux | تدفق، ورود | تێ ڕژان، ڕەوتی خوێن یا شلەیەك بۆ بەشێك لە لەش |
| Affluxion | تدفق، ورود، حشد | تێرژان، تێچڕژان |
| Affusion | سكب، صب | تێكردن، پیارۆیشتن، ڕشتن |
| After-birth | السخذ والمشيمة، المشيمة | ئاوەڵ و پەردەكانی |
| After-pain | الألم بعد الولادة، الحس | دوا ژان، ژانی پاش منداڵبوون، پاشەژان، هۆی ئەم ژانانە كرژبوونی منداڵدانە |
| After-image | الشبح، الأحساس البصري الذي يبقى بعد ان يزول المؤثر الخارجي الذي سببه | تارمایی، هەستێكی بینایيەكە هەر دەمێنێت دوای ئەوەی ئەو هۆیە كە پێكی هێنا نامێنێت |
| Afunctional | عطل، عاطل، فقدان، خلل في أو نقص في عمل نسيج أو عضو | بێكارە، لە كاركەوتوو، پەككەوتوو، پەككەوتن، لەكار كەوتن |
| Agalactia | نقص الحليب، خلل في ادرار الحليب | كەمشیری، مەمك وشك بوون، بێ شیری |
| Agamogenesis, Reproduction without fecundation | تناسل لاجنسي، تكاثر بدون إخصاب | ئەگامۆجەنەسز، زاوزێ كردن بەبێ یەكگرتن (جووتبوون)، بەبێ پیتێن |
| Agar-agar | اغار، مادة جيلاتينية من الأشنات | ئەگارئەگار، مادەیەكی جەلاتینییە لە قەوزە |

| | | |
|---|---|---|
| | | دەردەهێنرێت |
| Agenesia, Agenesis | النمو الغير الطبيعي، نقص في النماء، العنة، العقم | هەڵنەچوون، کە هەڵچوون (گەورە نەبوون)، نـەزۆکی، پیاوەتی نەمان |
| Agenosomia | قصور نمو الجهاز التناسلي او تشويه خلقي بانعدام الأعضاء التناسلية | ناتـــەواویی گەشـــەی کۆئەنـــدامی زاووزێ، یـــان شـێواوییەکی زگمـاکی بـە نـــەبوونی ئەندامـــەکانی زاوزێ |
| Agent | عامل، فاعل | هۆ، بکەر |
| Agglomerate, Massed to gether Aggregated | متكوم، متكدس | کەڵەکـــەبوو، چـــڕ، تێـــك چڕژاو |
| Agglutination | تـلازن، تكـدس كريـات الـدم الحمراء، بكتريا....الخ | ئەگلووتینێـــــــــــشن، تۆپـــــەڵبوون، پێکـــــەوە نووســـان و تۆپـــەڵبوون خڕۆکـــەی (خڕیلـــەی) ســـــووری خـــــوێن، باکتریا...هتد) |
| Agglutinin | لازن، لاصق، خلـية تتكون في الـدم بعـد الأصـابة بمـرض يلـــصق البكتريـــا المـــسببة للمرض ببعض وتتكدّس | ئـــەگلوتینین، نووســـێن (خانەیەکـــە لـــە خوێنـــدا پەیـــــدا دەبێـــــت دوای نەخۆشـــــی گرتنێـــــك باکتریـــای هـــۆی ئـــەو نەخۆشییە دەنووسێنێت و تۆپەڵیان دەکات) |
| Agglutinogens | ملزنات | ئەگلوتینۆجینـــــــەکان، |

| | | |
|---|---|---|
| | | نووسێنەکان |
| Aggregate | يكدس، يكوم | تۆپەڵکردن، کۆدەکاتەوە، کۆمەڵی دەکات، خەستنەسەریەك، بەهێشووکردن، تۆپەڵ، کۆمەڵ |
| Agitation | تهيج، إثارة، تهيج عنيف، هز | هاندان، تووڕە کردن، ڕاوەشاندن، شڵەقاندن، هەژاندن |
| Agitolalia | التسرع في التكلم | خێرادوو، خێرا قسەکردن، خێرا ئاخافتن |
| Aglobulia | نقص الكريات الحمر في الدم | کەمبوونی خڕۆکە سوورەکان لە خوێندا |
| Aglossia | غيبة اللسان الولادي | بێ زمان (زگماك) |
| Aglutition | صعوبة الأبتلاع | قووت نەچوون |
| Agnathia | غيبة الفك السفلي | بێ کاکیلەیی، بێ شەویلگەیی، نەبوونی کاکیلەی زگماك |
| Agnosia | العمه | سەرکوێری، نەناسینەوەی شت و کەسانی چاو پێکەوتراو ئەگەر چی بە تەواوی هەست پێ دەکرێن |
| Agony | النزع، شدة الألم | گیاندان، پەلەی سەرەمەرگ، ئازاری بێ پایان، گیانەلا، چەناگەکوتێ |

| | | |
|---|---|---|
| Agarophobia | رهبة الفضاء (الخوف من الخلوات والساحات المفتوحة) | ترسی دەشتودەر، دەشتەترسێ، لە دەشت و مەیانی کراوە ترسان |
| Agrammatism | لكنة، عجمة | ئەگراماتیزم، توانای دروست کردنی ڕستەی ڕاست نەبوون، قسە نەزان، قسەی ڕێکوپێك پێ نەکران |
| Agranulocytosis | فقد المحببات، فقد الخلايا المحببة | لەناوچوونی خانە دەنکۆڵەدارەکان |
| Agranulocytic Angina | الخُناق | خنکان، خنکێ |
| Agraphia | اللاكتابة، عدم امكانية بيان الرأي كتابة | ئەگرافیا، نەنووسایی، بێ دەسەڵاتی دەربڕینی بیر، نووسین یا بەنووسراوی |
| A. Absoluta | اللاكتابة المطلقة، عدم قابلية عمل حرف | ئەگرافیای ڕووت، بێ دەسەڵاتی نووسین یا دروست کردنی یەك پیت |
| A. Motor | اللاكتابة الحركية، فقدان قابلية تذكر أو نسيان، كيفية تحريك اليد اثناء الكتابة | ئەگرافیای بزێوتی، بزێوە نەنووسایی،بێ دەسەلاتی هاتنەوە بیر، لەبیرچوونەوەی، جووڵاندنی دەست لەکاتی نووسیندا |
| Agrippa | ولادة الطفل على ظهر شيء | بە سواری بوون (ی منداڵ لە دایك) بەسواری هاتن |

| | | |
|---|---|---|
| Agrippinus partus | الولادة راكباً | بەسواری بوون |
| Agromania | حـــب العزلـــة والتجـــول في الحقول | شەیدا (حەزی) تـەنیایی و گـــەڕانی دەشـــت، مانیـــای تەنیایی |
| Agrypnia | الأرق، قلة النوم | خـەو لێ زڕان، کەمخـەوی، شەونخوونی، بێخەوی |
| Ague | البرداء، الملاريا | لەرزوتا، لەرز، مەلاریا |
| A. cake | تضخم الطحال البردائي | گەورەبوونی سپڵی لەرزوتا |
| Ahypnia | الارق، فقدان النوم، سهاء | خـەو لێ زڕان، کەمخـەوی، بێخەوی، شەونخوونی |
| Ailment | مرض، علة، داء | نەخۆشی، دەرد، ناساغی |
| Ailurophobia | رهبة القطط | لـــە پـــشیلە ترســـان، پشیلەترسێ |
| Ainhum disease | مـرض اختنـاق الأصـابع، داء (انيوم) | دەردی (ئـــــــەنیوم) بەتایبـەتی لـە قولەرەشـدا، دەردی هـەڵوەرینی پەنجـە بچووکەکان |
| Air, the Atmosphere | الهواء | هـــەوا، بـــا، هـــەوای دەورووپشتمان |
| A.-cell | خلية هوائية | هـەوا خانـە، خانەیـەکی هەوایی |
| A.-embolism | سداد هوائي | هەوا ئیمبۆلیزم، بـە هـەوا گیران |

| | | |
|---|---|---|
| A.-hunger | عوز الهواء | هەناسەسوارى، تەنگەنەفەسى (لە وەرگرتن و دانەوەى هەناسەدا) |
| A.-tight | مسدود الهواء، محكم السد | هەوابڕ، كونبڕ، باش داخراو |
| A.-way | مجرى الهواء | باكێش، ڕێبازى هەوا |
| Air-passage | المجاري الهوائية، المنخراف والفم و الحنجرة والقصبات الهوائية والقصبات، المسالك الهوائية | هەوارۆ، ڕێبازەكانى هەوا، كونەلووتە و دەم و گەروو، و بۆرى هەوا، بارۆ |
| A., Reserve | الهواء الاحتياطي، مايتبقى من الهواء في الصدر بعد عملية زفير اعتيادية | باى يەدەگ، ئەو هەوايەى كە لەناو سنگدا دەمێنێتەوە پاش هەناسەدانەوە |
| A. Tidal | الهواء الجزري، الهواء المستعمل في كل عملية تنفس أي الداخل والخارج مع كل نفس | هەناسە هەوا |
| Akerlund Deformity | تشوه (اكرلند)، تشوه قلنسوة الاثني عشرى (العفجى) نتيجة القرحة | شێوانى كلاوەى دوازدە گرى بەهۆى بريندارببوونەوە |
| Akinesis | فقدان او قصور الحركة | لە جوولەكەوتن، لەگەركەوتن |
| Akinetic | لاحركي، معدوم الحركة | مەنگ، بێ جوولە، ناجوولەيى |
| Ala | جناح | باڵ |

| | | |
|---|---|---|
| Alalia, | اللانطق، قصور النطق الشللي | لالـــی، نـــەمانی توانـــای ئاخـاڤتن ـ زۆر و کـەم ـ لەبـەر دەردێکـی ناوچـەیی ئەندامـەکانی دەنـگ وەیـا شەلەلی ماسولکە |
| Alar | جناحي، أبطي | باڵی، بنّ هەنگلی |
| Albedo | بياض | سپێتی، سپیایی |
| Albicans | ابيض | سپی |
| Albicomas | ابيض الشعر | مووسپی، تـووك سـپی، قـژ سپی |
| Albinism | البهق، المهق | بەڵەکی |
| Albino | أبهق، أمهق | بەڵەك |
| Albinuria | بيلة بيضاء | میزی سپی |
| Albugo, leukoma | كثافة قرنية بيضاء | تانە، لەکەی چاو، لوکۆما |
| Albumin | الآح، بياض البيضة | سپێنەی هێلکە |
| Albumin | زلال، بروتين | ئەلبوومین، پرۆتین |
| Albuminuria | بيلة زلالية | ئـــــــــەلبۆمینمیزێ، ئەلبۆمینیوریا، ئـەلبومینی میـزێن، بـوونی ئـەلبومین لە میزدا |
| Albumon | ألبومـــون، زلال لايتخثـــر بالحرارة، يستحصل عليه مـن الدم | ئـــەلبوومۆن، پرۆتینێکـــە بەگــەرمی نامــەیێت، لـــە خوێن دەردەهێندرێت |

| | | |
|---|---|---|
| Alcaptonuria | بيلة الكابتونية | میـــــزی ئـــــەلکاپتۆنی، ئەلکاپتونە میزێن |
| Alchemy | الخيميـاء، الكيميـاء القديمـة، الفـن المزعـوم عـن امكانيـة تحويـل المعـادن الوضـيعة الى الذهب واكتشاف اكسير الحياة | خیمیـــا، کیمیـــای کـــۆن، کیمیاگەری، هونەری کۆنی توانـای گـۆڕینی کـانزای هــــەرزان بــــۆ زێــــر و دۆزینەوەی دەرمانی ژیان |
| Alcohol | الكحـول، ١ــ أي مركـب مـن المركبـات الـتي تتكـون مـن جزيئــة هايدروكاربونيــة متحدة بواحدة (او اكثر) من هايدروكسيلية ٢ــكحول الأثيـل Ethil ــ الكحول الاعتيادي ـ $C_2H_6O$. | کهول، هەر ئاوێتەیەکە کە لە گەردێکی هایدرۆکاربۆن و کۆمەڵەیــــــــــەکی هایدرۆکسیل پێك هاتبێت کهوولی ئەثیل |
| A. Absolute | الكحــول المطلــق، الكحــول الصرف | کهـــوولی ڕووت، کهـــوولی پەتی (ڕەها) $CH_3CH_2OH$ |
| A. Denatured | الكحــول المعــدوم، الكحــول الممـزوج بمـواد تجعلـها غـير صـالحة للـشرب ولكنها تبقى صالحة لأغراض أخرى | کهوولی پــەکخراو، کهـوولی گۆڕاو (لەکارخراو، تێکەڵی ئیثـانـۆڵ و میپانۆڵـه، کـه بەکـــەڵکی خواردنـــەوە نایەت و ژەهرە، پەکخراو) |
| Alcoholism | ادمان الكحول | ئـــەلکهولیزم، خـــوو بـــه کهوولـــــەوە گـــــرتن، ســـەرخۆش، مەســـت، بـــه کهول گیرۆدە بوون |
| Alcoholic | كحولي، سكير | کهـــوولی، پەیوەنـــد بـــه کهوولەوە، سەرخۆش |

| | | |
|---|---|---|
| Alembic | الأنبيق، جهاز للتقطير | چـــــەوتەك، ئـــــامرازی دڵۆپاندن |
| Allpo Boil, Button or Evil | حبة حلب، بثرة بغداد | كــانی خورمــا، زيپكــەی حەڵەب، زیپکەی بەغداد |
| Aleukomia | نقــص او فقــد الكريــات البيضاء | لوكيميا، نەبوونی یا کەمی خرۆکە سپیەکانی خوێن |
| Aleukocytosis | ابيض، ندرة الكريات البيض | ئەلووكوســــــــــايتوزس، سپیکەکەمێ |
| Alexander's Operation | عبـارة عـن تقـصير الـرابط المــدور الرحمــي لتــصحيح وضــع الــرحم المنتقــل الى الخلف | برينـــسازی ئەلەكـــساندەر، جـۆرە بريـنـسازييەکە بـۆ راســــتکردنەوەی بــــاری منداڵدانی بە پشتا کەوتوو |
| Alexia, Word blindmen | اللاقــراءة، عمــى الكلمــات، العمي القرائي | وشـەكوێری، كـوێری وشـە، نەخوێندنــــــەوە يـــــا دەســـتەڵاتی خوێندنـــەوە نــەبوون لەبــەر دەردێکـی ناوچەیی لە مێشکدا |
| Aleze | اليـزة، قمـاش مطـوي يوضـع على السرير لمحافظة الفـراش من التلوث بأفرازات المريض | ئەلیزە، متيلێکی سەرجێی چـەن جارێـك قـەد كـراوە دەنرێتە سەر پێخـەف بـۆ پاراستن |
| Alga, Algae | الآشنيات، الطحالب | پیـــــسبوون، پیـــــسیەوە چوون، قەبزە، قەوزە |
| Algefacient | مبرد | ساردکەرەوە |
| Algesi-, alges, algo- | بادئـة للدلالـة علـى العلاقـة بالألم | پێـشگرێكە بـۆ نیـشاندانی پەیوەند بە ئازاراوە |

| | | |
|---|---|---|
| Algesia | شدة الحسية للألم | الحسيات، هەست کردنی زۆر، ئازار، ژانە فرە هەستیاری |
| Algesichronometer | مؤقتة الألم، الة قياس الزمن المستغرق للشعور بالألم | ژان کاتێنەرە، ژانە کاتپێو، ئامرازێکە بۆ پێوانی ئەو کاتەی تێپەڕ دەبێت تا هەست بە ئێش دەکرێت |
| Algesthesia | حس الألم | هەستی ئازار، هەست بە ژان کردن |
| Algid | بارد، صقيعي | سارد، خووساری |
| A. Cholera | الكوليرا الأسيوية | ڕشانەوەی ئاسیایی، چاوە قووڵکەی ئاسیایی |
| A. State | الدور البارد لمرض | نۆرەساردیی نەخۆشی |
| Algolagnia | الشبق الأيلامي، انحراف جنسي يتلذذ فيه المصاب بايذاء او ايلام أيدى شخص أخر من الجنس المخالف له | ئازارە شەبەق، جۆرێکە لە لادانی جنسی یەکێکی دوچاری ئارەزووی ئازاردانی دەستی کەسێکی تری لە ڕەگەزی جیاواز دەکات |
| Algophobia | رهبة الألم | ژانەترسێ |
| Algor | قشعريرة | لەرز، مچوڕك، لەپڕ هەست بە سەرما کردن |
| Algor mortis | قشعريرة الموت | لەرزی سەرە مەرگ |
| Alible | مغذِ | بژێو، خۆراکدەرە |

| | | |
|---|---|---|
| Alices | بقع جلدية، طفح جلدي أحمر يسبق ظهور بثور الجدري | پەڵەی پێست، پەڵەی سووره پێش دەرکردنی زیپکەی ئاوڵە دەردەکەوێت |
| Alienation | جنون، خلل عقلي | شێتی، ئەقڵ تێکچوون |
| Alienism | جنون، خلل عقلي، علم الأمراض العقلية | شێتی، ئەقڵ سووکی، زانستی ناساغی ئەقڵ، دەردە هۆشزانی |
| Alienist | طبيب الأمراض العقلية | پزیشکی ناساغی ئەقڵی |
| Aliferous | مجنح، ذو جناح | باڵدار، باڵندە |
| Aliform | جناحي الشكل | وەك باڵ، باڵی، لەشێوەی باڵدا بوون |
| Aliment | غذاء، طعام، قوت | خواردەمەنی، خۆراك |
| Alimentary | غذائي، هضمي | خۆراکی، هەرسی |
| A. Bolus | اللقمة، الكتلة الغذائية بعد المضغ | پاروو، تۆپەڵە خۆراکی پاش جوین |
| A. Canal | القناة الهضمية | بۆری هەرس، جۆگەی هەرس |
| A. System | جهاز الهضم | کۆئەندامی هەرس، ڕشتەی هەرس |
| Alimentation | التغذية، إطعام | خۆراکپێدان، خواردن دەرخواردان |
| A. Rectal | تغذية شرجية | لە کۆمەوە خواردەمەنی پێدان |
| Aliphatic | دهني، شحمي | چەوری، پیوی |

